

لە بڵاوکراوەکانی سەعدوڵلا شێخانی ژمارە (٢٨)

چیرۆک

# دەرگا



نووسینی:

**کەمال سەعدی**

١٩٩٠



قصص

# البـــاب

كمال سعدي

نرخی دینارێـــکه

سەرپەرشتی چاپ : سەعدوڵلا شێخانی

نەخشەی بەرگ : محسن محمد امین

مطبعة الحوادث ـ بغداد ـ هاتف ٤١٥٢٦٨٥



له بلاوکراوەکانی سەعدوڵلا شێخانی ژمارە (٢٨)

چیرۆک

# دەرگـا

کەمـال سـەعدی

چاپخانەی ( الحوادث ) - بەغدا -

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە بە :ــ

- مامۆستای فۆلکلـۆر پەروەرو ڕابـەر عومەر شێخەڵا دەشتەکی ·
- نەتەوەکەم ·

دەنگ ووتیا ئەلفاتیحە ··· یەك پارچە دەست بەرزکرایەوەو دەستکرا بە فاتیحە خوێندن ·

واقی وورِما ··· بەحاڵە حاڵ بە الحمد لله ڕاگەیشتو وەکو ئەوان دەستی بۆ ڕووی بردەوەو ووتی :

ــ خوا لێی خۆش بێت ·

دووا بەدوای ئەوە لە پرمەی گریانیدا ، دەستە سرەکەی دەرهێناو کەوتە سەر هەڵگلۆفتنی چاوەکانیو بەدەم گریانەوە :

ــ بەحەزرەت بووم ئەمجارەش بیبینم ··· بەختم نەبوو کێ بزانێ بۆسەر تازیەمـــانەی دێم ··· کۆمەڵێك قسەی خۆشو پێکەنینم لابوو بەڵام فەلەك دەوری خۆی گێڕا ، ئەمجارەشیان مایە پووچ مامــەوە ··· هەرنەی دەبڕیەوە ··· پرسەکەرانیش لەکاری ئەم زەلامە ســــەریان سوورِمابوو ·

خۆیان بۆ نەگیراو دڵیان دایەوە :

ــ برادەر ئەم گریانو واوەیلایەی پێ ناوێ ··· مردن براگەورەیە لەپێش هەموومانە ··· دووایی ئەمەی ئێمـــە بەساڵا چوو بوو ، بەشی خۆی ژیانی بەسەر بردبوو ، نەخۆشیو پیریش زیاتر بێزاریان کرد بوو بۆیە بە مردنەکەی حەساوە ·

زیاتر لەپرمەی گریانی داو بەدەم گریانەوە :

ــ چۆن وا دەڵێن ··· پیری چی ··· بەستە زمانە تازە لەهەرەتی

# « گومـان »

بۆ هەر کوێ دەچوو وەکو سێبەرەکەی بەدوایەوە بوو .... دەم نادەمێك هۆپێـکی دەکرد ، ئەویش لە دوای دەچەقیو لە شوێنی خۆی نەدەبزووت ...

ـ عەجایەب دەبێ کێ بێو مەبەستی چی بێ ؟! ئەم سەرو ئەوسەری شەقامی بازاڕی کرد هـــەر لـــەدوای نەبۆوە ... توانای نەمـــا ... ئەوجارەیان ڕووی تێکردو چـاوی خستە ناو چاوەکانیو هەر لـــە تۆقی سەرییەوە تاکو ژێر پێی تێی ڕووانی ... بەدەم تێڕوانینەوە لـــەبەر خۆیدا دەی ووت :

ـ دەبێ کۆنە هاوڕێی سەردەمی خوێنـــدنی سەرەتاییم نەبێ ؟! زەینم کۆرە ، بێگومان هەر هەوەو دەیەوێ دەستی خۆی پێش بخـاتو قەرزارم بکاتەوە ... خۆی پێـــداکردو کـــەوتە مـاچکردنیو بەدەم پێکەنینەوە :

ـ ئێی کوی ... باشی ... بەچی خەریکی ، هەی بێ وەفـــا ، ئەوە چەند لەمێژە خۆت بزر کردووە .

ئەمـەو دەیان قسەی تر ... هەر نەی بڕاندەوە ... کـــابراش بەتوڕەیی‌یەوە دەستەکانی فڕێدا ، دەمانچەکەی لەبەرپشتی دەرهێنـــا لەسەر تەختەی نیوچەوانی دانا ... پڕ لە قینەوە پێی ووت :

- برۆ هەی کەڵەك چی ... دەتەوێ بەم زمانە لووسە لە خشتەم ببەیت ، جــارێك توانیت بەڵام ئەمجارەیان ناتوانی ... مـن خۆم شاردۆتەوە یان تۆ هــەی قورمساغ ! کـە ئوتومۆبیلەکە چی خۆت نەبوو چۆن پێت فرۆشتم ، وا دەزانی منیش لەو کەسانەم چاو لە مافی خـۆم بپۆشم ... قسە هەزارەو دووانی بەکارە ، ئێستا پارەکەم دەدەیتـەوە یان بە قوربانی گولەیەکت بکەم ، بۆ هەزارانی وەك خۆت تەمبێت بکەم ؟

کـە ناوی گولەو کوشتنی گوێ لێبوو ، شلەژا ، ڕەنـگی وەکو پەلـکە پیـاز سپی هەڵـگەڕا ... هـەر زوو پێناسەکەی بۆ دەرهێناو ووتی :

- مـن گەمژەڵم ، بێ ئەوەی لە ناسینت دڵنیابم باوەشم پیـا کردی ... باوەڕت هەبێت نە دەتناسمو نە دەمناسی ، تۆ بە هـەڵە تێم گەیشتوی من نەئوتومۆبیلم هەیەو نە دەشزانم ئوتومۆبیل لێ بخوڕم ... کابرا سەیرێـکی پێناسەکەی کردو هەندێك لێی وورد بۆوە ، لـــەوە دەچوو باوەڕی نەکردبێت ... ووتی :

- ماقوولە تۆ نەبیت ؟!

ئەمەندەی ووتو پێناسەکەی دایەوە ...

هـەر قاچێـکی کرد بـــە دوانو وەکو مامز تێی تەقاند ... ناوە ناوەش ئاوڕێـکی دواوەی خۆی دەدایەوە ... کابراش یاغر یاغر بـــە دوایەوە هەنـگاوی دەناو بەچاوی قینەوە تێی دەڕوانی .

ئاداری/١٩٨٥

★ ★ ★

# « دەرگا »

سلیمان هاوڕێیەکی خۆشەویستی بوو ... ماوەیەکی زۆر بوو بەهۆی بەند بوونی‌یەوە لێك دابڕابوون .

کـە چرپەی بەربوونی‌ی بەرگوێ کەوت ، پاکەتێك پاقلاوەو قامکە گوڵێکی دەستکردی بۆکڕی‌و بەرەو ماڵیان کـەوتە ڕێ ... تەنیا جارێك ماڵیانی بینی بوو ، لە دۆزینەوەی گومانی هەبوو ... سەرەڕای ئەمەش دڵی بەدەرگاشینەکـەو کۆنە سکرابەکـەی بەر دەرگـای ماڵیان خۆش بوو ...

بەدەم ڕێـگاوە بیری دەیان شتی بۆ دەهات .

پیاو ماوەیەکی درێژ هاوڕێی خۆی نەبینێ دەبێ چی بـــکا ... مەگـەر وورد و درشت کۆنە یادگاری چەندان ساڵەی تەمەن هەڵڕێژێت ، پێکەنین‌و گریان تێـکەڵ بەیەك‌بکا . گەیشتە گەڕەکەکە ... لە دوورەوە قەرەباڵغی‌یەکی زۆری بەدی کرد ... بەرەو غەڵبە غەڵبی خەڵـــکەکە ڕۆیشت ... چاوی بەدەرگا شینەکە کەوت .. شاگەشکە بوو .. ملی لە ژووری ناو هەر لەدەم دەرگاوە لەقاقای پێکەنینی داو ووتی :

ـ هاوڕێی گیانی قەت خەڵەت ناکا ...

خەڵـکەکە ئەیلەق مابوون ، بەســـەر سوڕمانەوە ســـەیریان دەکرد ... بەلایەوە ئاسایی بوو کـــەسی لەوان نەدەناسی . بـــەرەو دیوەخـــان کشاندیان ... حەشاماتێـــکی زۆر دانیشتبوون جمـــەی دەهات ... بەزۆرە ملێ جێی خۆی کردەوە . چایان بۆ دانا ... لەگەڵ خواردنەوەی هـــەر قومێك سەیرێکی ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد ، وەك شتێکی وون کردبێ‌و لێی بگەڕێ .

ڕووی لە دانیشتووەکان کرد ، لەقاقای پێکەنینیدا ووتی :

ـ بەڕاستی زۆر پێ خۆشحاڵ بووم ... باوەڕتان هـــەبێ لەگـــەڵ بیستنی ئەم هەواڵە قاچەکانم لە خۆشیان زەوی نەگرت ... باوەڕناکەم ئێوەش بەقەدەر من دڵخۆش بووبن ... بۆ خۆی لێیدا ... هـــەروا بزانن تازە لـــە دایك بووە ... پێنج ساڵ بەدەم خۆشە مرۆڤ لە شارو کەس‌و کـــاری دور بێ .

بەردەوام بوو لە قسەکردندا ، ناوە ناوەش ئاوڕێکی دەورو بەری خۆی دەدایەوەو چاوی لە سلێمانی هاوڕێی دەگێڕا .... دانیشـــتوانی دیوەخانەکەش سەیری یەکتری‌یان دەکرد ، هەر دووکەس ســـەریان خستبووە بن گوێی یەك پسەپسیان بوو ... دیقەتی ڕووی گشتیانی دا تەنیا خەندەیەکیان لێ بەدی بـــکا کـــەچی وەکو مـــاری سڕ لەجێی خۆیان حەپەسابوون .

لە ناکاودا دەستەیەك زەلام بەژوور کەوتن‌و لەگەڵ دانیشتندا بەیەك

لاوی‌دا بوو ··· دوایی سلیمان تازە ژنی هێنا بوو ، کۆزی ساوا بوو ··

یەکیان خۆی بۆ نەگیراو قسەکەی پێ بڕی ···

ســەری خۆی لەقاندو ووتی :

ـ هەر زوو زانیم ئەم برادەرە بەهەڵەداچووە ، ئەم پێکەنینەی بێ هۆ نی‌یە ··· برادەر ئەوە ماڵی سلێمان نی‌یە ··· تۆ بە هەڵەدا چووی، سلێمان ماوەو نەمردووە ماڵیشیان دەرگاشینەکەی ئەوسەری گەڕەکە ·

حوزەیرانی ١٩٨٨



# « دەنگ نووســان »

چــەند سالێك بوو خۆشت دەویست ... زۆر جـاران دەتویست ڕازی دڵتی بۆ بدرکێنیتو هەگبــەی دەروونتی بۆ بکەیتەوە ، بەڵام جورئەتت نەدەکرد ... لەبەر خۆتەوە دەتووت :

- ئەگەر قسەیەکی خەڵەتم پێ بڵێ خۆ جارێـکی تر چـــاوم لـــە بەرامبەری هەڵنایەت ...

دەیان بیری ترت بە خەیاڵدا دەهات ... لەدووا ساڵی خوێندنتدا بە پێویستت زانی شتێك بکەیتو پەردە لەسەر ئەم شەرمە هەڵبگریت ، خۆشەویستی‌یەکەتی بۆ بدرکێنیت . بۆ ئەم مەبەستەش لـــە هــەلێك دەگەڕایت . گەشتی زانستی نزیك کەوتەوە ، وەکو ساڵانی پێشـــوو دەست کرا بە ناو نووسین ... بە دڵنیا بوونت لە بەشـــدار بوونی خۆشەویستەکەت شاگەشکە بوویت ، وا هەستت کرد تازە چــــاوت هەڵێناوە و لەدایك بوویت ... بەلاتەوە باشترین هەل بوو لە گەشتێکی وا دوورو درێژو دوور لە کۆلیج ، دەروازەی هەموو شتی بۆ بــکەیتەوەو ئەوەی هەتە بۆی هەڵڕێژیت . گەشتەکە کرا ... چاوە چاوی ئەوەت بوو بێتە تەنیشتتەوە دابنیشێ . بەڵام بەســـەر خۆیشی نەهێناو لـــە کورسی‌یەکەی دواتەوە دانیشت ...

کەوتیتە بیرکردنەوە ‎٠٠‎ لەبەرخۆتەوە دەتووت :

- تۆ بڵێی تائێستا هەستی بەم خۆشەویستی‌یە نەکردبێ یان لەبەر قسەی خەڵك بەسەر خۆی ناهێنێو نایەتەلام ‎٠‎

زۆر بیری تریشت بەخەیاڵدا دەهـــات ‎٠٠٠‎ ئـەوەی لێ خۆش کردبوویت ، دانیشتنەکەی بوو لە دواتەوە ‎٠‎

دووبارە دەتووتەوە :

- ئەگەر منی خۆش‌نەویستبایە لـــە پشتمـــەوە دانەدەنیشت ‎٠‎ چاوەڕێی ئەوەت دەکرد قسەیەکت لەگەڵ بـکاتو دەرگای گفتوگۆت بۆ بخـــاتە سەرپشت ، بەڵام لە بێدەنـــگی بەولاوە هیچی ترت لێ بەدی نەکرد ‎٠٠٠‎ کەوتیتە بیرکردنەوە کـە چۆن بیخەیتە قسەو بابەتێـــکی لەگـەڵ بـکەیتەوە ، بۆیە پارچەیەك کێکت پێشکەش کردو ووتت :

- ئەم پارچـــە کێـکە بخۆ ، زۆر شیرینو خۆشـــە ‎٠٠٠‎ ویستت قسەی تریش بـــکەیت ، بەڵام ئەو کێکەکەی ڕەت کردەوەو ســـوپاسی کردیت ‎٠‎

زۆر غەمبار بوویت ‎٠٠٠‎ ئارەقەی ســـوور و شینت کرد بەخۆت داشکایتەوە ‎٠٠٠‎ هیوات بڕا ‎٠٠٠‎ پاسەکەش بەردەوام بوو لە ڕێگا بڕین ‎٠‎

دوای تۆزێك بە دەستە ناسکەکەی مشتێ تۆ کودوی برژاوی بۆ ڕاگرتی ‎٠٠٠‎ هەناسەت هاتەوەبەر ‎٠٠٠‎ شاگەشکە بوویت ‎٠‎ هەرچەندە قـــەت تۆوی برژاوت نەخوار دبوو کـــەچی وەرت گرت ‎٠‎ لەگـــەڵ شکاندنی هـــەر دەنکێکدا کۆمەڵێك قسەت بەخەیاڵدا دەهـــات ‎٠‎ تاوای لێهـــات ئەمجارەیات بەتەواوی دڵت لێی دابین بوو ‎٠٠٠‎ بڕیارتدا ســـەرەتای بەرنامەی ئەم گەشتە بەسووڕانەوەی دوو قۆڵی لەگەڵ ئەودا

بەناو باخچـەی زەورا دەست پێ بکەیتو خۆشەویستیی خـۆتی بۆ بدرکێنیت • گەیشتنەجێ ••• لەبەر ماندوێتیو شەکەتی تا ئێـوارە لێی ڕاکشان ••• لەخـەو هـەستایت ••• گەرووت گیرابوو ••• دەنگت نووسا بوو •••

هـەندێك خـۆت هێناو بردو دەستت کرد بە ئحم •• ئحم بەڵام سوودی نەبوو ••• تەنانەت تەنیا ووشەیەکت لەدەم دەرنەچوو •• هەر لەو ڕۆژەوە تاکو دوا چرکەی گەڕانەوەشت دەنگت هەر نەکرایەوە ••• ئەوەندەت بۆ دەکرا بچیتە بەرامبەریو چاو بخەیتە ناو چاوە جوانەکانیو وێنـەی خۆتی تیـا ببینیتەوە •••

ئەویش دڵی دەدایتەوەو دەی ووت :

ـ گەشتەکەت بەدڵ نەکـەوت ، دوا گەشتیشە ئەگینـا بۆساڵی ئایندە تۆڵەت دەکردەوە •

تۆش لەســەرلەقاندن و بەدەست ئیشارەت دان بەولاوە هیچی ترت لەتوانادا نەبوو •

ئاداری ١٩٨٧



# « تـاوان »

بۆ نزیکەی سالێك دەچـــوو مەراقی لەم قوتابخانەیە دابوو ...
خووی بە دانیشتنی بەردەرگاکەیەوە گرتبوو ... زەلامێکی ســـەرو ریش سپیی چاوکزی پەك کەوتوو بوو ... هەموو بەیانی‌یەك لەگـەڵ تاریك‌و ڕووندا دەگەیشتە جێ ، لە ژوانی دوا نەدەکەوت .

لەگـەڵ هاتنی یەکـــەم قوتابی تا دوا قوتابی بەرد بارینی ئـەم بەستەزمانەیان دەکردو بەشێتە شێتە گوێیان پڕ دەکرد .

بەڕێوەبەری قوتابخانەکە زۆر بیری لەحاڵی ئەم زاتە دەکردەوە بێ ئەوەی بـگاتە شتێك ... زۆر جارانیش داوای هاتنە ژوورەوەی لێ دەکردو پارەو یارمـــەتی بۆ ڕادەگرت کـــەچی وەری نەدەگرت‌و بەماتی دەمـــایەوە .

دیمەنێکی زۆر غەمگین بوو ... نە وازی لێ دەهێنان‌و یەقـــەی بەرئەدان ، نە یارمەتی‌یەکەی وەر دەگرت .

لەوە نەدەچوو شێت یان گێل‌و هوڕ بێت بۆیە ببووە هـــەوێنی بیرکردنەوەی بەڕێوەبەرو مامۆستایانی قوتابخانەکە ... بیرو هۆشیان لەلای ئەو بوو دەیانویست تێی بگەن .

بەردبارین‌و نارەحەت کردنیشی لەلایەن قوتابی‌یانەوە زیاتر تەنگیات بە بەڕێوەبەر هەڵچنی بوو ، هانیان دەدا هەوڵی دوورخستنەوەی بدات یان لەبنج‌و بنەوانی نهێنی‌یەکانی دەروونی‌ی بگات ٠

بەیانی‌یەکی زوو ، تازە زەنگی وانەی یەکەم لێ درابوو ، قیژەیەك بەرزبۆوە ، لەدەرەوەی قوتابخانەدا بووە هەلا ٠٠٠ دوا بەدوای ئەوەش قوتابیان بەڕاکردن بەرەو ژووری بەڕێوەبەر هاتن ، پێیان ڕاگەیاند کابرا دەیەوێ ( لاڤان ) ببات ٠٠٠

لاڤان قورگی پڕ گریان بوو ٠٠٠ لە ئامێزی کابرادا وەکو داربی دەلەرزی ٠٠٠ وەختا بوو تۆق ببا ٠

بەڕێوەبەر خۆی گەیاندێ ، لاڤانی لەباوەش دەرهێناو ووتی :

ـ ڕۆڵە مەگری ٠٠٠ وەکو باوکت وایە نات خوات ٠٠٠ ترسی بۆچی‌یە ، قەت مرۆڤی وات نەبینیوە ؟!

لاڤانیش لەترسان دەمی بەسەر یەکدا قرسابوو نووقەی بڕا بوو ٠٠٠

لاڤانی بەڕێ کردە ژوورەوە ڕوی کردە کابرا ووتی :

ـ خاڵە گیان من لەمەبەستت ناگەم ، دەتەوێ یاری‌یان لەگەڵ بکەیت یان بیان تۆقێنیت ؟

هیچ وەڵامی نەدایەوە ٠ فرمێسك چاوەکانی پڕ کردبوو ٠ ٠ ٠ دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی زیو بەسەر ڕیشە سپی‌یەکەیدا دەتکایە خوارەوە ٠

لێی دووبارە کردەوە ، بێ سوود بوو ٠٠٠ وازی لێ هێناو گەڕاوە ژوورەکەی خۆی ٠

هەر لەو ڕۆژەوە کەوتە بیرکردنەوەو لەبەر خۆیەوە دەیووت :

– زێدە لەم هـــەموو منالانەی قوتابخانە بۆ تەنیا لاقانی گرت !
ئەگەر مەسەلە یاریکردن بێت خۆ گشت منالان ئێسکیان سووکەو حەز لەیاری دەکـــەن ، بەلام گرتنو گوشینی لاقـــان بەم شێوەیە قـــەت لەیاریکردن ناچێت ...

دەیان بیری تری بۆ دەهات . تابڵێی مەسەلەیەکی ئالۆزو لێل بوو وەکو گرێ کوێرە وابوو هەر چەند هەولی بۆ دەدا بۆی نەدەکرایەوە .

ڕۆژێـــکی تر زەنـــگی دوا وانەی قوتابخانە لێی دەدا ، پەیتا پەیتا منالان دەچوونەوە ... هاواری منالان بەرز بۆوە ، بەشەپۆل خـــۆیان کوتایە ژووری کارگێڕی ، بەگریان ڕوویان کردە بەڕێوەبەرو ووتیان :

مامۆستا دیسان شێتەکـــە لاقانی گرتـــەوەو دەیەوێ بیبـــات . بەڕێوەبەر ڕای کردە دەرەوە ، کەوتە دوایو لاقانی لێ سەندەوە .

ئەم جارەیان هـــەر بەوەندە نەوەستا ، پیلی کـــابرای گرتو ڕایکێشایە ژوورەکەی خۆی . پێی ووت :

– پێم نالێی بۆچی مەراقت لەم منالە داوەو وازی لێ ناهێنی ...
خۆ ئەگەر مەسەلە یاریکردن بێت ئەمانەی تریش وەکو ئـــەو منالنو حەز لەیاری کردن دەکـــەن ، بەلام دیارە تۆ نیـــازت خراپەو دەتەوێ کـــەتنێك بـــکەی ؟!

بێ دەنـــگی پەردەی بەســـەردا کێشا ... جاران ئاسایی خوڕ ، خوڕ فرمێســـکی بەســـەر ڕوودا دەتـــکایە خوارەوەو کۆکـــە کۆکیش شپرزەی کردبوو ...

بەزۆر شێواز لەگەڵی دوا بێ سوود بوو ... کە زانی بەنەرمی ناگاتە هیچ ئەنجامێك ، دەستی کرد بە هەڕەشە لێ کردن ...

تەلەفۆنەکەی ڕاکێشا بەردەمی خۆی ووتی :

ـ هەر ئێستا ئەگەر قسە نەکەیت پۆلیست بۆ بانگ دەکەم ؟

هەموو لەشی هاتە لەرزین ، خۆی هەڵکوتا سەر قاچەکانیو تەلەفۆنەکەی لەدەستی دەرهێنا ، کەوتە قسە :

ـ بەس ئەمجارە لێم گەڕێو پۆلیسم بۆ بانگ مەکە هەموو شتێکت پێ دەڵێم .

هەناسەیەکی هاتەوە بەر ، تەلەفۆنەکەی دوور خستەوەو ووتی :

ـ خاڵە گیان فەرموو ... چیت هەیە بیڵی منیش ئەوەی لە توانام دا هەبێت بۆتی دەکەمو درێغی ناکەم .

ڕوی کردە بەڕێوەبەر ، بە قوڕگی پڕ لەگریانەوە ووتی :

ـ مـن دڕندە نیم ، شێتیش نیم ... وەکو ئێوە مرۆڤمو هۆشم هەیە . بەڵام مناڵان لێم دەترسێن ، بە شێتم تێ دەگەن ... تەنانەت ئێوەش هەروام تێ دەگەن ، ناهەقیشتان ناگرم ...

لەپڕمەی گریانی دا ، بە دەنگێکی بەرزەوە ووتی :

ـ بەس نی‌یە کچەکەشم هەروام تێ دەگاو ...

قسەکەی تەواو نەکرد ، قووتی داوە .

بەڕێوەبەریش لەناو ژانەکانی دا توابۆوە ... فرمێسك لە چاوی قەتیس مـابوو ...

ڕوی تێ کردەوە ، دەستی خستەوە سەر شانیو ووتی :

ـ دەزانم تۆ دڕندە نیت ··· بەڵام من تێ ناکەم ! تکایە قسەکانت تەواو بـکە ؟

گرژییەوەو ووتی :

ـ دەزانم بۆ وادەڵێی ··· دەتەوێ نهێنییەك بدرکێنمو بەیەکجاری لەدیتنی بێبەشم بکەیت ·

ئەمەندەی ووتو هەستایە سەر پێ ویستی بچێتە دەرەوە ·

بەڕێوەبەر دەستی گرتو پێی ووت :

ـ بەڵێنت داومەتێ هەموو شتێکم پێ بڵێی،کەچی وا دەبینم دەتەوێ بچیتە دەرەوەو پێم نەڵێی ؟

پێکەنینو گریانی تێکەڵ بەیەك کردبوو ··· چەند جارێك لێوەکانی لێك دان ویستی شتێك بڵێ بەڵام قسەی بۆ نەهات ·

دووبارە دەستی دایەوە تەلەفۆنەکەو ترساندییەوە ·

زوو دەستی خستەوە گیرفانی ، پێناسـەکەی دەرهێنـا خسـتیە سەرمێزی بەڕێوەبەرو پڕ بەدەنگ هاواری کرد :

ـ ئەمەش پێناسەکەم ئەگەر بڕوام پێ ناکەیت ·· من باوکی لاڤانم·

بۆ دەبێ منالی خۆشم لێم قەدەغە بێتو نەتوانم بی دوێنم ··· بـۆ ئەمە تاوان بێت ·

دوای خوێندنەوەی پێناسەك ، بە ووردی هەر لە تۆقی سەرییەوە تا ژێر پێی کەوتە ڕوانینی دیمەنیکابراو لەبەر خۆیەوە ووتی :

ـ ناچێتە ئەقڵەوە ئەمە باوکی لاڤان بێت بەڵام ناوەکەش دەقاو دەق خۆیـەتی !!

هەندێك سەری لەقاندو ووتی :

ـ نازانم چۆن باوەڕت پێ بکەم کە تۆ باوکی لاڤانیت ؟!

لەپرمەی گریانی داو ووتی :

ـ کە تۆ بەم پێناسە باوەڕ نەکەیت ، پێم ناڵێی ئەی بەچی بـاوەڕ دەکەیت ؟

زیاتر لێی چووە پێش‌و کەوتە دڵ دانەوەی ، پێی ووت :

ـ خاڵە گیان لێم ناگیرێت ··· سەرم لێ شێواوە ··· کە سەیری دیمەنی تۆو لاڤان دەکەم بەقەد زەوی‌و ئاسمان دوورن · لاڤان وا ڕێك‌و پێك‌و گەشاوە ، تۆش پیرو پەك کەوتە سەرو ریش تێـك ئـاڵۆزاو ··· نازانم ئەمە چۆنە ؟

سەری بەرزکردەوە ، ڕوی لەئاسمان کردو ووتی :

ـ ئەم خوایە شایەدە من باوکی لاڤانم ·

دەستی گرت‌و لەسەر کورسی‌یەکە داینیشاندو ووتی :

ـ ئێستا دڵنیابە باوەڕت پێ دەکەم ·

هەناسەیەکی درێژی هەڵـکێشا ووتی :

ـ کەواتە لاڤانم دەدەیتەوە !

ـ بەڵێ ، منالی خۆتەو سەربـەستی لەبردنـەوەی کەس نی‌یـە ڕێگات پێ بگرێ · بەڵام شتێك هەیە دەبێ بیزانیت ، لاڤان لەژێر چاودێری

بەشی سەرپەرشتی ساوایانە ، دەبێ ئاگاداریان بکەمەوە ، ئەوسا بەتۆی دەسپێرم ٠

تەلەفۆنەکەی هەڵگرت ، بەڕێوەبەری سەرپەرشتی ساوایانی وەرگرت ٠٠٠ ووردو درشت مەسەلەکەی بۆ گێڕاوە ٠٠٠

دوای تۆزێك تەلەفۆنەکەی داخستەوە ٠٠٠ لەبەر خۆیەوە ووتی :

ـ ئەی لەم زاڵمە ٠٠٠ ژنی خۆی کوشتووە ، منالێکیشی فرۆشتووە ٠٠٠ ئێستاش کە لە بەندیخانە بەربووەو دەیەوێ ئەم تاقە منالەشی بفرۆشێت ٠٠٠ کێ بزانێ دادگە حەجری خستۆتە سەرو مافی حەزانەی لێ سەندۆتەوە ٠٠٠ چاك بوو تەلەفۆنم کرد ٠٠٠

لەبەرێوەبەر چووە پێش و پێی ووت :

ـ لەگەڵ کێ قسە دەکەیت ٠٠٠ چیان ووت ، دەم دەنەوە ؟

ـ نەخێر ٠

خۆی هەڵکوتا سەرمێزەکەی و بەهەردوو دەست چاکەتەکەی ڕاکێشا ووتی :

ـ زانیم نهێنی یەکەم پێ دەدرکێنیت و نام دەیتەوە ٠

شوباتی ١٩٨٨



# « یۆبیلی ئالتوونی »

هەر لەو ڕۆژەوەی هەواڵی دەرکردنی خۆمم لە کۆلێجدا گوێ لێ بوو ، ئۆقرەم لێ بڕا... دەرگا نەما ڕووی تێ نەکەم... بەڕێوەبەری کۆلێجو سەرۆکی زانکۆ ، گشتیانم بەسەر کردنەوەو سوودی نەبوو... زۆرم بیرکردەوە بێ هودە بوو ... دەرکردنم لەسەر هەڵەیەکی بچووکی کۆمپیۆتەر ناچێتە ئەقڵی هیچ کەسێکەوە ... جەنابی بەڕێوەبەری کۆلێج خۆیشی دەیووت ( بەلامەوە سەیرە کە ناوی تۆش کەوتۆتە نێو لیستەی کۆمپیۆتەرەوە ) سەرەڕای ئەمەش هیچی بۆ نەکردم ئەوەندە نەبێت پێی ڕاگەیاندم کە خۆم بگەیەنمە لای جەنابی وەزیرو مەسەلەکەمی بۆ ڕوون بکەمەوە بەڵکو چارەیەکم بکا .

ئەوەی ڕاستی بێت چوونە لای جەنابی وەزیرم پشت گوێ نەخستبوو ... دوو جاران بۆ دیدەنیی سەفەرم کرد نەگەیشتمە خزمەتی ...

ئەم مەسەلەیە زیاتر لە مانگێکی بەسەردا ڕەت بوو ... ڕۆژێکیان بەخەیاڵم داهات کە بارەگای یەکێتیی گشتیی قوتابییان و لاوانیش بەسەر بکەمەوە ، تاکە شوێن بوو بەسەرم نەکردبێتەوە... ناوی خوام لێ هێناو بۆم تێ تەقاند ... گەیشتمە جێ ... هەر لەبەردەرگای

حەوشە تا دەگاتە ژوورەوە لەم بەرو لەو بەر کیژۆلەی جوان وەستا بوون… گوڵ بەدەست بەچەپڵە بەرێیان کردم تا گەیشتمە بەردەم جێگری سەرۆك ، ئەویش بێ سێو دوو بەرەو ساڵۆنە گشتییەکە رای کێشام .

تێنەگەیشتم مەسەلە چییەو ماوەشی نەدام هیچی بۆ بدرکێنم… کە قاچیشم نایە ژووژرەوە یەك پارچە دانیشتووی ساڵۆنەکە لەبەرم هەڵسانەوەو بەفەرموو فەرموو شەرمی دونیایان بەسەرمدا باراند … ئارەقەی سوورو شینم بەدەردابوو … هەموو تاجو نەجمە لەسەر شان بوون ، بریقو هۆری قۆندەرەی پایان هۆڵەکەی خستبووە سەما … لەریزی پێشەوە لاقەنەفەیەکی چۆڵم بەدی کرد ، لێی دانیشتمو شادەیەکی بەهەقم هێنا … چاو قوچانێکی پێنەچوو پاقلاوەو کۆکام بۆ هات… لە خواردنەوەی دو دڵ بووم … ئاخیری هەر جورئەتی ئەوەم نەکرد بیخۆم… هەندێك خۆم هێناو برد ویستم لەسەرۆکی یەکێتی بپرسمو مەسەلەکەمی تێ بگەیەنم بەڵام بەختی من لە پاریزگارەوە تا دەگاتە سەرۆکی زانکۆو بەرێوەبەری کۆلیجیشمان روویان لەوێ کردو بەژوور کەوتن … بووە رۆژی حەشر … هەر لەگەڵ هاتنی مێوانەکان ئەو دوو کەسەی لەتەنیشتم بوون هەڵسانە سەر پێ ، منیش بێ ئەوەی بزانم مەسەلە چییە هەڵسامە سەر پێ ، قورم بۆ گیراوە ، ئیتر لە یەکەم مێوان بگرە تا دەگاتە دوا مێوان کەوتنە دەست لە ملانمانو بە پیرۆزە مێشکیان پڕ کردم … واقم وورما بوو نەم دەزانی ئەم پیرۆز باییەیان لەچی بوو … دەمویست خۆم رزگار کەم بەڵام خراپتر لە دواتر بوو… هەر جارێکیش سەرم هەڵدەبڕیو سەرۆکی زانکۆو بەرێوەبەرەکەمانم دەبینی هێندەی تر هەناسەم لێ دەبڕا… وێنەگری تەلەفزیۆنیش وەکو پەروانە بە دەورەماندا سووری دەداوە …

ئەوەی ڕاستی بێت مەسەلەکەی خۆمم لەبیر چوو ، ما بکەومە بیرکردنەوەو بزانم ئەم کۆبونەوەیە چی‌یە ، بەلام هەر نەمزانی ... ئاخیری بڕیارم دا پێی بڵێم ، ڕووم کردە سەرۆکی یەکێتی‌و بەسەد ناڵەی عەلی پێم ووت (دەزانی من بۆچی هاتوومە ؟ ) ئەویش سەری خۆی لەقاندو بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی : ( دەزانم... دەزانم ئەی چۆن یاخوا بەخێر بێی ) ..

دەستی بۆ پاکەتەکەی درێژ کردو جگارەیەکی دامێ ، هەر چەندە قەت جگارەم نەکێشابوو کەچی نازانم چۆن خۆم لەبیر کرد وەرم گرت.

دووبارە جورئەتم دایەوە بەر خۆم‌و ڕووم وەرچەرخاندەوە لای هەر وەکو جاران ووتم (دەزانی ...) ماوەی تەواو کردنی نەدام ، بەسەر لەقاندنەوە ووتی (دەزانم ... دەزانم) لەو لاشەوە سەرۆکی زانکۆ سکرتێرەکەی نارد بەشوێنماو بانگی کردم ... چوومە لای ، سەری هێنا پشت گوێم‌و ووتی :

- دەبێ بمانبەخشیت ، بەخۆت دەزانی ڕۆتینی دائرە وا لە مرۆڤ دەکا کە شەرمەزار بێت‌و چاکەی پێ نەکرێ ... ئەگینا ئێمە دەزانین ناوەکەی تۆ بەهەڵە کەوتۆتە نێو لیستەی کۆمپیۆتەرو سووچی ئێمەی تیانیە ... بەلام سەرەڕای ئەمەش قەیناکا تۆ هەر لەم ڕۆوە دەتوانی بگەڕێیتەوە کۆلێج‌و وەکو جاران بخوێنیت ، بەڕێوەبەریشتان خۆی لێرەیەو ئاگادارە .

پێکەنینم هات ... ویستم سوپاسی بکەم بەلام قوڕگم گیراو قسەم بۆ نەهات ئەوەندە نەبێت منیش وەکو سەرۆکی یەکێتی دوو جار سەرم بۆی لەقاند .

ئەوەندەی شاگەشکەی ئەوە بووم کە لە قەنەفە زلەکە ڕزگارم بوو، ئەوەندە بە مەسەلەی گەڕانەوەکەم دڵخۆش نەبووم ... بەرەو دەرگا کشام ...

سەرۆکی یەکێتی هەڵساو هاتە دوام ووتی :

وا بزانم من بەهەڵە لە مەبەستت گەیشتووم ... هیچ ئیشست نەبوو ؟

هیچ خۆم تێك نەدا ووتم :

ـ نەخێر ، تەنیا بۆ پیرۆزباییتان هاتبووم بەڵام نازانم بەچی بۆ نەیەکەوەیە ؟

ووتی :

ـ جەژنی یوبیلی ئاڵتوونیی یەکێتیمانە .

دوو جاران سەری خۆم بۆ لەقاندو بەرەو دەرگای حەوشە کشام .

کانونی یەکەمی ١٩٨٥



# « شێخ عەبدوڵا »

چەند ساڵێك بەسەر مافی خانەنشینێتی یەکەیدا ڕەت بوو بوو ، بێ ئەوەی ئاوڕێکی لێ بدەنەوەو ڕەزامەندی‌ی بۆ بنوێنن . فەرمانبەرێکی کارامەو لێهاتوو بوو بۆیە دەستیان لێ‌ی بەرنەدەبوو...

سکاڵایەکی جوان‌و ڕازاوەی بۆ بەڕێوەبەری گشتی نووسی‌و تیایدا ناوی شێخ عەبدوڵایەکی هێنا بوو گوایا لە یەکێ لە بەڕێوەبەرێتی یەکانی سەر بە بەڕێوەبەرێتی یە گشتی یەکەی خۆیانەو فەرمانبەرێـکی بەتواناو بەهرەدارە ، گرەنتی ئەوەی بۆ دەدات کە شایستەی پڕکردنەوەی ئـەو فەرمانە بێت‌و لە شوێنی ئەو بکرێت بە بەڕێوەبەری پشکنین .

بەڕێوەبەری گشتیش دەم‌و دەست ڕەزامەندی‌ی بۆ نواند بەمەرجێ ئەو شێخ عەبدوڵا ناوە لە شوێنی ئەو بکرێت بە بەڕێوەبەر ...

هەر ئەوڕۆژە دەست کرا بە تەلەفۆن کردن ... داوای نـاردنی لیستەی خەدەمات‌و دۆسی‌یەی شێخیان کرد لەگـەڵ هاتنی خۆیشی بۆ دیدەنی‌ی جەنـابی بەڕێوەبـەری گشـتی . لەبەڕێوەبـەری دارایـی‌و کارگێڕی‌یەوە تاکو دەگاتە بچوکترین فەرمانبەری خۆیەتی فەرمانبەران،

شاباشیان بۆی کردو چاکەی ئەم هەڵبژاردنەی شێخیان کردە هی خۆ ...

بەهەر حاڵ شێخ بەگورجی گەیشتە جێو هاتە لایان ... قەتیش باوەڕی نەدەکرد ئەو خەڵەتەیان کردبێت ، فەرمانبەرێکی وون بووی پەك کەوتووی بەساڵاچووی وا دووره پەرێزیـان بـۆ ئەم فەرمـانە مـەزنە بیرکەوتبێتەوە ، لە کاتێکدا بەری چەند ڕۆژێك بەناوی کەم تەرخەمی یەوە مووچەی حەفتەیەکی یان لێ بڕی بوو .

ئەو نیوەڕۆیەیان گەورەو بچووکی بەڕێوەبەرێتیی گشتی لەسـەر حسابی شێخ کەوتنە سەر خواردنی کەباب ، کەس شـەقی لـە کەبـاب هەڵنەدەدا ... بێ لە دابەش کردنی دیاریش بەسەر بەڕێوەبەری دارایی‌و کارگێڕی‌و گەورەو بچووکی بەشی خۆیەتی ...

نان‌و کەباب خۆش بێت ، ئیش‌و کاری حەفتەیەکیان بە نیو سەعات ئەنجام دا ... بەخێرایی نووسراوی هەڵبژاردنەکەی شێخیان لەچاپ‌داو بەرەو نووسینگەی بەڕێوەبەری گشتی یان بەڕێ کرد . هەمووی چەنـــد دەقیقەیەکی نەبرد هاتن بەدوای شـێخ‌داو بـەرەو ژووری بەڕێـوەبەری گشتی یان کشاند ...

شێخ لە خۆشی یاندا هەر ئەوەتا نەدەفڕی ... زیکەی پێڵاوەکانی ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت ... بۆین باخەکەشی وا توند بەستبوو ئەوەتـا نەی دەخنکاند ... ئەوەندەی قۆڵانیاو تیرۆس لەخۆی دابوو ئەو ناوەی تەنی بۆوە ...

شێخ لەلایەن جەنابی بەڕێوەبەری گشتی یەوە پێشوازی لێ کرا .

جەنابی بەڕێوەبەر گشتی کەوتە پیاهەڵدانی شێخو لاواندنەوەی ، گوایا بۆ ئەو فەرمانە پڕ بەپێستی خۆیەتیو هەر قابیلی ئەوە ...

شێخیش ناوە ناوە دەستی بۆ چاویلکەکەی دەبردەوەو کۆکە کۆکی لەخۆی دەهێناو قونە تاتکێی بوو ...

لەناکاو بەڕێوەبەری پشـکنین بەژوور کـەوتو فەرمانبەرێـکیشی بەدوایەوە بوو ... ڕوی کردە بەڕێوەبەری گشتیو پێی ووت :

ـ جەناب ئەمەش شێخ عەبدوڵا کە بەجەنـابتم ووتبوو بۆ دانـانی لەشوێنی من .

بەڕێوەبەری گشتی بەسەر سوورمانەوە ووتی :

ـ چۆن ؟! .. بۆ گوایە ئێمە چەند شێخ عەبدوڵامان هەیە ؟!

مایسی ١٩٨٧



# « مەسەلە دە دینارەکەیە »

دە ساڵی ڕەبەقم لەگەڵ دا بەسەر برد بێ ئەوەی تۆزقاڵێك سەرم لە لێپرسراوی بەشی خۆیەتی فەرمانبەران دەربچێ • کاروباری لیژنـەی حسابکردنی خزمەتی خستبووە ژێر دەستی خۆی‌یەوە ، ماوەی نەدەدایـن یارمەتی بدەین •

ڕۆژ نەبوو دەیان کرێـکارو فەرمانبـەری دائـرەکانی سـەر بـە دەزگاکەمان ، ڕوومان تێ نەکەن‌و دادو بـێ داد لە دەسـت دواکەوتـنی حسابکردنی خزمەتی سەربازی‌و کرێکاری‌یان نەکەن •••

حەقیان بوو ، هەر ڕۆژێکی دواخستنی ئەم کارە دەبوو بـە هـۆی زیان لێدانیان‌و بەرزنەبوونەوەی موچەکەیان • زۆر جـاران خـۆم تـێ هەڵدەقورتاندو دەمویست هەندێك لەو کاروبارانەم بداتێ‌و لەجیاتی ئەو ئەرکەکە بەجێ بێنم ، بەڵام ماوەی نەدەدام‌و قـەرزاریشی دەکردمـەوە • ناچار دەبووم هەناسەیەکی سارد هەڵکێشم‌و بەکت‌و ماتی بمێنمەوە •

ڕۆژێکیان کرێکارێك لە دوورەوە هاتبوو ••• هەر پرتەو بۆڵـەی بوو ••• منیش گوێم بۆ هەڵخست ، دیار بوو هەر باسی سێ‌سەد دیناری

دەکرد گوایە لەو ڕۆژەوەی مەعامەلەکەی لامـــان خەوتووە ئەو گدژمــە پارەیەی لەدەست چووە ٠

دەت ووت لەگەڵ ئەویشیان نی‌یە هەر خۆی لەگوورە نەبرد ٠٠٠ دوای بێ هیوا بوون ڕوی لەمن کردو بەوپەڕی بێزاری‌یەوە بەدەنگی بەرز هاواری کرد :

– کوا ویژدان ؟! کوا مرۆڤایەتی ؟! کوا دین ؟! من ئێستاکە لەو پەڕی کەم دەرامەتیدامو منداڵەکانم نەخۆشن ، پارەم نی‌یە لێیانی خەرج بکەم کەچی ئێوەش بەزەییتان پێم دا نایەتەوە ٠ دڵم بۆی زووڕایەوە بەڵام بێ سوود بوو ٠٠٠ هــەر لــەوڕۆژەوە کەوتــمە بیرکردنەوە لــە نهێنی دواخستنی ئەم جۆرە مەعامەلاتانە کەچی هەر لەجیهــانی پڕ لــە نهێنی‌و شاراوەیی‌دا مانەوە تا ئەوکاتەی لێپرسراوی بەشی خۆیەتی خانەنشــین کراو ئەرکی هەڵسووڕانی بەشەکە بەمن سپێردرا ٠٠٠

دوای فێربوونم بڕیارمدا بەر لە هەموو شــتێك دەســتێك بــەم مەعامەلاتانەدا بهێنمو ئەم کرێکارو فەرمانبەرە بەستەزمانانە لەم گێژاوە ڕزگار بکەم ٠٠٠ ناوی خوام لێ‌هێناو لە تــاقە ڕۆژی یەکەمدا بەشــێکی زۆریم جێ بەجێ کرد ٠

بۆ بەیانیش بەچاپم گەیاندن‌و بۆلای جەنابی بەڕێوەبەرم بــرد٠٠٠

قەڵەمی لەسەر نووسراوەکان چەقی ٢ هۆپێــکی لێــکردو چــاوی خستە ناو چاوم‌و ووتی :

– ئەم ئەزیەتە چی بوو ؟!

منیش زۆر ئاسایی ووتم :

ـ جەناب هیچ ئەزیەت نیە ، پەنا بەخوا هەر ئێستا ئەوانـــەی تریش تەواو دەکـــەم ٠٠٠

قسەکـــانم تەواو نەکردبوو ، بەتووڕەیی‌یەوە چووە دەرەوە ٠٠٠ سەرم سووڕما ٠٠٠ لەبەر خۆمەوە ووتم :

ـ تۆ بڵێی شتێکی خراپم کردبێت یان جەنابی بەڕێوەبەر هـــەر خۆی تەواو نەبێو گیروگرفتی تایبەتی‌ی خۆی هەبێتو بەمنی دارشتبێ ٠ دەیان بیری تریشم دەکردەوە ٠

تاکو حەفتەیەکیش مەعامەلەکان لەژووری بەڕێوەبەر دەرنەهاتن ٠ وەکو بەردی ژێر گۆم‌یان بەسەر هات ٠

خۆم پێ نەگیرا ، بۆ بەسەرکردنەوەی دووبارە چوومەوە لای ٠٠٠ هێشتان وورتەم لێوە نەهاتبوو ، خێرا مەعامەلە کـــانی خســـتە نـــاو دەستمو ووتی :

ـ لە لای خۆت گلیان بدەوە ، مانـگی تەنیا دوو دانەی بۆ ئیمـــزا بنێرە لام ٠

پێکەنینم هات ووتم :

ـ جەناب ئەم ئەرکەی بۆچی‌یە ؟! وا تەواو بووە ، ڕزگاریان بکە با ڕزگارمـــان بێت ٠

بەتووڕەیی‌یەوە ووتی :

ـ دەتەوێ نان بڕوامان بکەیت ؟!٠٠ یەك‌کارتۆن مریشك بـــەدەم خۆشـــە !

زیاتر سەرم سووڕما ، هیچی لێ تێ‌نەگەیشتم ووتم :

– جەناب نان برانی چیو مریشکی چی ؟! من هیچ لەمانە تێ ناگەم تــکایە تێم بــگەیەنە .

هێمن بۆوە ، بەڕێز لێنانەوە دای‌نیشاندم ... ناردی چــایەکی شیرینم بۆ هــات ...

ئیتر مابکەوێتە شکاندنەوەی لێپرسراوی کۆنو ووتی :

– دەبوایە هەرزوو بزانم سووچی تۆ نەبووە ، کەم تەرخەمی لــەو قورمساغە بووە تێی نەگەیاندوی ... ئەی چۆن من دەزانم ئــەوە چ ماڵێکە بۆ خۆی خانەنشین بووەو خەمی ئێمەشی نی‌یە ... چ باکــی پێمانە ئێمە لە نیوچەوانی ئەم کرێــکارو فەرمانبەرانەوە مانــگی دە تاکە دیناری ڕەبەق بدۆڕێنین .

لەمەبەستی نەگەیشتم پێم ووتەوە :

– جەناب بەتەواوی تێم بگەیەنە مەسەلەی ئەم دە دینارە چی‌یە ؟ ووتی :

– مەســـەلە دە دینارەکەیە ... یاســـا ڕێی بەئێمەی لیژنەی حسابکردنی خزمەتی سەربازیو کرێکاری داوە مانــگی دە دینارمان بۆ بخرێتە سەر مووچەکەمان بەمەرجێك مەعامەلەکان لە مانگێكدا لە دووان کەمتر نەبن . جا ئەگەر ئێمـــە ئەو مەعامەلاتانە هەموو جێ بەجێ بکەین ئەوا تاکو چەند مانگێك بەبێ ئەم خەرجی‌یە دەمێنینەوە .

حوزەیران ١٩٨٣



# « كۆنە هەوار »

ماوەیەكی زۆر بوو لـە كەس‌و كاری دوور بوو ••• باری ژیـان وای لێ كردبوو بۆ پەیداكردنی لوقمەیەك نان حەوت كێو ببڕێت • • • پیـاو بـكەوێتە وولاتی غەریبی ، غوربەتی هەڵدەستێ‌و یادی گـەورەو بچووكی ئاواییەكەی دەكاتەوە •

زۆر جاران دۆش دادەما ، بیری ئاواییەكـەی دەكردەوەو دەی ووت :

ـ بەس ئەم جارەیان دەستم لـە گوندەكەم گیربێتەوە قـەت جێی ناهێڵم •••

ئێوارەیەكیان لە چایخانەی مەچكۆ دانیشتبوو ••• هەواڵی مردنی یەكێك لە خزمەكانی پێ گەیشت ••• لەجێی خۆی تاسا ••• بێ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵێ‌و بەكەسێك بڵێ ، بەگورجی چووە گـەراج‌و بـەرەو گوندەكەی كەوتە ڕێ ••• پێش بانـگی شێوان گەیشتە جێ ••• ملی ڕێـگای مزگەوتی گەورەی گرتە بەر ••• لەتەنیشت خاوەن پرسـەوە دانیشت‌و فاتیحە خوێندرا ••• دەمی كردەوەو كەوتە لاواندنەوەی :

- پیاوی چاك بوو ··· بەحەزرەت بووم ئەمجارەشیان بم دیتبا ··· دەردی غەریبی زۆر گرانە ··· بەرد لەجێی خۆی بەسەنگە ···

زۆر قسەی تریشی کرد ··· ئەوانیش سەری خۆیان بۆ دەلەقـاندو قسەکانی‌یان پەسەند دەکرد ···

زیاتر تێ هەلچۆوە :

- بڕیارم داوە لەم زوانە واز لە وولآتی غـــەریبی بێنم‌و بگەڕێمەوە کۆنە هەواری خۆم ··· بەس تۆزێك دەستی خۆم ببینم‌و دەرامەتم بێتـە دەست ، دەگەڕێمەوە ئێرە ، نێو ئێوەی خزم‌و کەس‌و کارم ···

ئەوەی هەی بوو هەآی ڕشت تا مەلای شێوانیش بانـــگی دا ··· نوێژیان کردو لێی بوونەوە ··· هەر کەسەی پێلآوەکانی لەقاچ‌و کردو بەرەو مـــاڵ گـــەڕایەوە بێ ئەوەی کەسێك تەکلیفی بردنەوە مالێی لێ بـــکا ···

زۆر غەمبـــار بوو ··· دۆش دامـــا ، قەت ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتبوو ··· سەیرێکی هۆڵی مزگەوتەکەی کرد لەخۆی‌و مـەلای گوند زیاتر کەسی تری لێ نەمابۆوە ···

زۆر برسی بوو ··· نانی نیوەڕۆیشی نەخواردبوو ، بۆیە هێزی لێ بڕابوو ، زگی قوڕەی لێوە دەهات ·

ناوە ناوەش سەیرێکی مەلای دەکرد ، دڵی بەو خۆش بوو لەگـــەڵ خۆی بیباتە ماڵەوەو شتێکی دەرخوارد بدا · مەلاش کەوتبووە گەرمـەی

نوێژان‌و نوێژی لەدوای نوێژ دادەبەست ٠٠٠ ناچـار ئەویش دەسـتی بەنوێژکردن کرد ٠٠٠ جارو باریش سەیرێـکی مەلای دەکردو لـەدڵی خۆیدا دەیووت ( هەر هیچ نەبێت مەلا لەگەڵ خۆی دەمباتەوە ) ٠

کاتێك مەلا لەنوێژکردن بۆوە هەڵسا سەر پێ ، زۆر دڵی خۆش بوو ٠٠٠ ئەویش وازی لەنوێژکردن هێناو خۆی ئامادە کرد ٠ بەڵام مەلا دەستی دایە قورئانێك‌و دانیشتەوە ٠٠٠ دەستی کرد بە قورئان خوێندن تا بەری بەیان ٠

ئەویش دەستی خستە ژێر چەناگەی ، تا بەیانی کەوتە بیرکردنەوە٠

مارتی ١٩٨٧



# « تەلەفزیۆنە ڕەش‌و سپی‌یەکە »

تەلەفزیۆنە ڕەش‌و سپی‌یەکەی لەمێژەوە هەبوو ... هەموو خەڵك بوون بەخاوەنی تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ ، ئەو هەروا مابۆوە ...

تەلەفزیۆنەکەی وەکو زەلامی پەككەوتوو شەت‌و گێڕ ببوو ... چۆن پیاوی پیر چاوەکانی شەش‌و بێش دەبێت ، ئەویش ئەوها وێنەکانی بەشێواوی نیشان دەدا ... دەتووت بە جنۆکە ئیش دەکا هەردەمەی لەسەر بارێك بوو ... تەنانەت هەندێك جاران وێنەکانی سەر بەرەو خوار دەنواند یان دەنگی دەنووساو تا چەند سەعاتێك کپ دەبوو ... هەراجی بکردبا پارەی پێنج کیلۆ گۆشتی نەدەکرد بۆیە قەت بیری لای وەستای بۆ نەدەکردەوە . هەر جارێکیش وێنەو دەنگی بشێوابا مشتەکۆڵێکی پیادا دەکێشاو دەی هێناوە باری جاران‌و دەی خستەوە گەڕ ... تەنانەت وای لێهاتبوو چوار چێوەکەی لەگەڵ زۆری مشت پیاکێشاندا شەق‌و پەق ببوو ...

بەم شێوەیە چەند ساڵێکی لەگەڵ بەسەر برد تاکو لەپڕ یاخی بوو . وێنەو دەنگ بەیەکجاری سەریان هەڵگرت‌و بە چەکوشیش نەگەڕانەوە ...

مناڵەکان لەبەر نەبینینی فلیمی کارتۆن نارەحەت بوون ... زۆر بیری کردەوە شتێك بـکاتو دڵی مناڵەکـانی نەرەنجێنێ ... بـــێ ســوود بوو ...

ئێوارەیەکی درەنـگ خستیـیە سـەر شـــانیو بۆ بانی نهۆمی سەرەوەی برد ... مناڵەکان شاگەشکە بوون ووتیان :

ـ بابە دیارە بۆمان چاك دەکەیتەوە ؟

بەزەردەخەنەوە ووتی :

ـ بەڵێ رۆڵە گیان هەر ئێستا ...

ئەمەندەی ووتو تاکو هێزی لەبەردا بوو لەبەرزایی دوو نهـــۆم فرێی دا خوارەوە ...

مناڵەکان لەپرمەی گریانیان دا ووتیان :

ـ بابە گیـان بۆ لێت شکاندین ، دیارە ئێمەت خۆش ناوێ ؟

رووی تێ کردنو بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی :

ـ ئێوەم خۆش دەوێ بۆیە شکاندم ... ئەگەر وام نەکردبایە قەت نەدەبووینە خاوەنی تەلەفزیۆنی رەنگاو رەنگ ، سەبرم لێ بـــگرن سلفەیەکی بۆ وەردەگرمو دەیـکرم .

**کانونی یەکەمی ١٩٨٤**



# « ووجـاغ کوێر »

چووی بۆ بازارگەی هەرەوەزی ... لە شوێنی فرۆشتنی شوشە ، شۆخێکی جوانی قژ درێژت بینی ، لەگەڵ یەکێك لە ئافرەتە کرێکارەکانی بازارگە گفتوگۆیان بوو ... بەرامبەری وەکو بت وەستایت ، چـاوت خستە ناو چاوی ... چـەند هەنـگاوێك لێی چوویتە پێش ، ویستت بیدوێنی ، ڕووی خۆی وەرچەرخاندو بەرەو دەرگای دەرەوە کشـا .. کەوتیتە دوای ... لەبەر چڕی خەڵکەکە پێی نەگەیشتی ... لەبەرچاو وون بوو ... هـەڵویستەیەکت کـردو کـەمێك بیرت کردەوە ... گەڕایتەوە لای ئەو ئافرەتەی تۆزێك پێشتر قسەی لەگەڵ دەکرد ، بۆ وێ کەوتنی ناوونیشانی ڕووی پرسیارت تێی کرد :

ـ ئەو ئافرەتەی پێش ئێستا لەلات بوو دەتناسی ؟

ـ بەڵێ .

ـ منیش دەی ناسم ، ویستم بێمـە لای بەڵام لەبەر قەرەباڵغی نەمتوانی و لـەبەر چـاو وون بوو . . . ماڵیشیـانم بزر کردوەو نایدۆزمەوە .

ـ ناوی ژیانە ، کچی خالیدی برینپێچە لەگەڕەکی مەنتکاوە .

هەر ئەو ڕۆژە چوویتە گەڕەکەکە ... دوای گەڕانو سوڕانێکی زۆر هەموو برینپێچەکانی گەڕەکت بەسەرکردەوە .. لەسەرەتا لەوە دەچوو ئیشەکەت مەیسەر نەبێت ... دووبارە بەماڵەکان هەڵچیتەوە ... گوایا ماڵیان بەرامبەر مزگەوتەکەیە ... یاغر یاغر بۆی کەوتی‌یە ڕێ ... گەیشتی‌یە جێ ... دوو جار پشمیت . . . هەڵوێستەیەکت کرد ، لەبیری خۆتەوەو وتت (دوو جار پشمین نیشانەی خێرە ) شاگەشکە بوویت ... ناوی خوات لێ هێنا ، چەند هەنگاوێکی تریش چوویتە پێش ، گەیشتیتە بەرامبەر ئەو دەرگایەی ناوونیشانەکەیان بۆت هەڵدابوو ... پەنجەت کێشا بەزەنگەکەدا ... زەلامێکی پیری شەتو گێڕی بەساڵا چوو دەرگای کردەوە ... پێت ووت :

ـ جەنابتان خالیدی برین پێچن ؟

لەخۆشیا نەتزانی چی بڵێی ، کەوتی‌یە گێژاوی بیرکردنەوە ، مشاوەرەت لەگەڵ خۆتدا دەکرد ...

کابرا ئەبلەق مابوو ... لەمەبەستت نەدەگەیشت ... زیاتر لێت هاتە پێش ، ڕووی تێ کردیت ووتی :

ـ بۆ دەنگ ناکەیت ... ئیشت بەمن هەبوو ؟!

ڕاچڵەکیت ، ووریا بوویتەوە ، تۆزێك سەرەتاتکێی ژوورەوەت کرد لە گۆلکێکی بەستراوە چی ترت نەدیت پێت ووت :

ـ بەڵێ ، بەڵام چۆن بزانم تۆ هەمان کەسیت ؟!

بەسەر سوورمانەوە سەیری کردیت ، بە مرۆڤێکی شێواوت تێ گەیشت ... دەرگاکەی بەسەر ڕووتدا داخست .

لەبەر خۆتەوە ووتت :

ـ دڵنیام خۆیەتی ، ناچێتە ئەقڵەوە لەگەرەکێك دوو برین پێچ بەم ناوە هــەبن ·· گریمان خۆیشی بوو ، چــۆن داوای دەستی ئافرەتێك دەکرێ هیچی لێ نەزاندرێ ··· وویستت بەقسەی چــاوێری مێشکت بــکەیتو بەســەر (زات)دا زاڵ بیت ووازی لێ بهێنیت بەڵام دوو دڵ بوویت ··· ئۆقرەت نەمابوو ··· بڕیارت دا شتێك بکەیت · دووبارە زەنگت لێداوە · دەرگاکــەی کردەوە ، هێشتان وورتەت لــەدەم دەر نەچوو بوو ووتی :

ـ دیسان ئەوە تۆی ؟!

هێمنت کردەوە ، ووتت :

ـ ژیانی کچت ···

قسەکەت تەواو نەکردبوو ، لەقاقای پێکەنینی دا ، ووتی :

ـ هیچ مناڵم نی‌یە ، ووجاغ کوێرم ·

★ ★ ★

---

**تێبینی :**

**(ذات) = ذات الدنیا**

**ذات العلیا = چاودێری‌مێشك**

# « پێشوازی »

جەنابی پارێزگار لەگەڵ مارسیدسەکەی خۆی بەکاروباری تایبەتی ناردی بۆ ئۆرزۆزدی باك ٠

وای بەباش زانی پێش چوونە ئەوێ فیتە بەدەورەیەکی ناو بازاڕی بۆ بـکا ٠٠٠ تامەزرۆی سواربوونی ئوتومبیلی مارسیدس بوو ٠٠٠ لە دوواوەدا وەکو لێپرسراوە گەورەکان دانیشتبوو ٠٠٠ عـەبدوڵای باش چاوەشیش هەروەکو ڕۆژان لە پێشەوەی ئوتومبیلەکە بوو ٠

لەبەر خۆیەوە ووتی :

ـ لەوانەیە ئەوەی بمبینێ بڵێ ئەمەش پارێزگاری نوێیە ، خـــۆ دووریش نییە ! ئەوانەی دەبن بەپارێزگار هیچیان لەمن زیاتر نییە ٠٠٠ ئەگـەر مەسەلە بوونی شەهادەش بێت ئەوا بەقەد دوو شەهادەی ئەوان هەر ساقیت بوونم لە ساڵانی خوێندندا هەیە ٠٠٠ ئەگـــەر وا نەبوایە ئێستا لەوانیشم ڕەت کرد بوو ٠٠٠

دەیان بیری تر لەناو مێشکیدا جەنجاڵی دەکرد ٠٠٠ تا گـەیشتنە ناو بازاڕ ، لەهەموو گۆڕەپانەکاندا قاچ درا بە ئەرزاو هەیتە سڵاویان بۆ

دەسەند ··· ئەو هاوڕێیەی قەت سڵاوی لێی نەکردبوو ، خـۆی بۆ دەچەماندەوەو بە هەر دوو دەست سەلامی لێ دەکرد ·

سواربوونی مارسیدسیش هـەر مـاوەیەك خۆشە ··· بێزار بوو ··· بەرەو ئۆرزدی کەوتنە ڕێ ···

لەدوورەوە دەرگای ئۆرزدی بۆ خرایە سەر پشت ، مەگـەر خـوا بزانێ چـۆن پێشوازی‌یەکی لێ کرا ··· لەبەر چڕی خەڵـکەکە جێی تایەکانیی نەبوو بسوورێتەوە ··· لەگـەڵ هۆپ کردندا کرێـکارانی گەراجەکە تێـکڕا خۆیان هەڵکوتا سـەر دەرگاکە ، هەر ئەوەتا یەدەی دەرگاکە لەگەڵ دەستی‌یان دەرنەدەچوو ··· دەرگای ئوتومبیلەکەیان بۆ کردەوە ··· لەهـەموو ڕاستێکەوە ڕووی تێ کرا ··· هەریەکەی کۆمەڵێك گلەیی‌و گـازاندەو داخـوازی بۆ هـەڵرشتی ··· یەکێك غەسالەی دەوویست ··· ئەوی تر بەفرکەرو تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ یان تەباخی پێنج چاوەی دەوویست ··· کەس نەبوو شتی نەوێ ···

کەسی‌یانی تەریق نەکردەوە ، سەری خۆی لەقاندو ووتی :

ـ ئاسانە ، ئاسان ·

لەلایەکەی تریشەوە جەنابی بەڕێوەبەری ئۆرزدی بەخۆی سکرتێرو کۆمەڵێك فەرمانبەری‌یەوە وەکو کوچ کووچە بەدوای یەکەوە ڕێچکەیان گرتبوو ، بەرەو لای هاتن ···

خۆیان کردە ناو زگی خەڵـکەکەو بەدەست ڕێگایان بۆی کردەوەو بەرەو ژوورەوە کشاندیان ···

وەختابوو لە پێکەنینا پەق ببا ، دانی بەخۆیدا گرتو قووتی دایەوە ٠

جەنابی بەڕێوەبەر دەستی بۆ قەرەوێتەکەی بردەوەو هەندێکی تر توونەی کردو چاویلکەکەشی تۆزێك هێنا خوارەوە ، دوای دوو ئەمو کۆکە کۆکێك رووی تێی کــردو کــەوتە ستایشی خۆیو خستنــە رووی گیروگرفتی کارو تەنگ چەڵەمەی ڕۆژانەو زاڵ بوونی بلیمەتانەی خۆی بەسەر ئەو هەموو تەگەرانەدا بێ ئەوەی کەسیش پێی زانی بێت ٠٠٠

ئەوەندە لەســەر ڕۆیشت تا کارگەیشتە ئەوە ، وویستی بە زوویی پێی بڵێو قسەکــە لێرەدا ببڕێتــەوە ٠ بەڵام مــاوەی نەدا ، زیاتر تێ هەڵچۆوە ، ئەو جارەیان زیاتر لەجاران بە حەماسەوە قسەی دەکردو ئارەقی سوورو شینی بەدەردابوو ٠

ناچار بوو سەری خۆی بۆ بلەقێنێتو تەئیدی بکا ٠

سەر لەقاندنو پەسەندکردنی ئەویش هێندەی تر تیژی کردەوە تا وای لێهات کۆنەکای چــەند ساڵەی بۆ بەبا کرد ٠ زۆر بێزار بوو ٠٠٠ زانی ووس نابێتەوە ، هیچی تر خۆی بۆ نەگیراو پێی ووت :

ـ من سکرتێری پارێزگارم ، بەناوی جــەنابەوە هــاتوومە بەفر کەرێكو تەلەفزیۆنێــکی ڕەنــگاو ڕەنگ بۆ ماڵەوەیان وەربــگرم ٠ ئەگەریش بلوێ شتێکیش لەم بابەتانە بدەیتە من خراپ نی‌یە ٠

حەپەسا ٠٠٠ ڕەنگی زەرد هەڵــگەڕا ٠٠٠ ســەری خستە ســەر مێزەکەو نووقەی لێوەبڕا ٠

بەسەد فاتیحەو قول‌وەللا بەئاگای هێنایەوەو داواکەی لێ دووبارە کردەوە ۰

وەرەقەیەکی ڕاکێشا بەر دەمی‌و پێی ووت :

ـ ئەمەش داخوازی‌یەکەی جەنابی پارێزگار ۰

ئەویش ووتی :

ـ ئەی هی مـــن ؟

بەسەری لێوی‌یەوە وەڵامی دایەوەو ووتی :

ـ دەتوانیت وەکو ئەم خەڵـکە چاوەڕێ بیت ۰

مایسی ١٩٨٧



## « تـــابلۆ »

هونەرمەندێك هەتا مردیش نەیتوانی دیمەنی گوندەکەی بخاتە ناو چوارچێوەی تابلــۆیەك ··· درێژایی تەمەنی بەڕەنگ کردنی ئەو تــاکە تابلــۆیە بەسەر برد ···

هەر جارێك تەواوی دەکرد ، دوای تێ ڕووانینێکی قووڵ بەڕاستەو چەپ فلچەی ڕەنگی پێدا دەهێنا ، دەیکوژاندەوە · وای لێهات کۆمەڵێك ڕەنگ لەسەر ڕووی تابلۆکەدا کەڵەکەبوو ، وەکو پەلکەزێڕینەی پاش بارانی بەهاران خۆی دەنواند ···

کەمرد تەنیا ئەو تابلۆیەی لەدوا بەجێ ما ···



# « شانۆگەری یەکی سەرنەکەوتوو »

دوای جاڕدانو بانگاشە بۆ کردنێکی زۆر ، پەردە لەسەر شــانۆ هەڵدرایەوە ··· جەماوەرێکی زۆر لە هونەردۆستان دانیشتبوون ···

شانۆگەری یەکە پێشکەش کرا ··· مێرد منداڵێك دەوری کوێخای دەگێڕا ··· زەلامێکی سەرو ڕیش ماشیش لەدەوری لاوێك دا ···

غەڵبە غەڵب لەناو هۆڵەکە پەیا بوو··· دانە دانە بینەران پشتیان لەشــانۆ کردو بــەرەو دەرگا خۆیــان خزانــد ··· تەنیــا دەرهێنــەرو ئەکتەرەکان لەوێ مانەوە ·



# « ئەو شاعیرەی کەشێت بوو »

بووە غەڵبە غەڵب ... ئاوڕێکم لە دوام دایەوە ، خەڵکی بازاڕ بەسەر یەکدا پڕژا بوون ... یەك پارچە ڕەش دەچوونەوە ... لەوە دەچوو شتێك بدرێت یان هەواڵێکی گرینگ جاڕ بدرێت...

منیش وەکو خەڵکەکە ڕووم تێ کردو خۆم خزاندە ناویانەوە ... هیچم بەدی نەکرد... ڕووم تێکردن‌و پێم ووتن :

ـ من هیچ بەدی ناکەم ، ئێوە لەدەورەی چی کۆبونەتەوە ؟!

بەدەست ئیشارەتیان بۆ زەلامێك کرد ، ووتیان :

ـ ئەم شاعیرە ئێستا شێت بوو .



# سوپـاس

- بۆ مامۆستای چیرۆك نووس (حسـين عـارف) بـۆ پیاچوونـەوەو سەرنجدانی لەسەر چیرۆکەکانی ئەم کتێبـە ٠

- بۆ برای چیرۆك نووسم کاك ( سابیر رەشید ) بۆ پیاچوونـەوەی لە ڕووی هونەریو زمانەوانیەوە ٠

- بۆ برای فۆلکلـۆر پەروەر ( سەعدوللا شێخانی ) کە ئـەرکی لـە چاپدانی ئەم کتێبەو سەرپەرشتی چاپی گرتە ئەستۆی خۆی ٠

- بۆ هونەرمەند ( محسن محمد امین ) کە نەخشەی بەرگەکەی بـۆ کێشـاوم ٠

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- کەمال سەعدی ، لە ساڵی ١٩٥٦دا لە دایک بووە ٠
- لە شاری هەولێردا پیشەی پارێزە ٠
- لە ئەدەبدا چیرۆک نووسەو لە هونەردا شێوەکارە ٠

# لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١ ـ شەش کورتە چیرۆکی کوردی ـ ١٩٧٦ ـ بە هاوبەشی لەگـەڵ سابیر ڕەشیددا ٠
٢ ـ کۆمەڵە چیرۆکێک بە ناوی (وون بوون) ـ ١٩٨٤ ـ ٠
٣ ـ دەرگا ـ چیرۆک ـ ١٩٩٠ ٠

نرخی (١) دیناره

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق ببغداد ٨٨٥ لسنة ١٩٩٠